(بسم الله الرحمن الرحيم)

مرۆڤ ئەو بوونەوەرە موگناتیسیەیە بیر لە هەر جۆرە شتێك بكاتەوە و باوەڕی پێی هەبێ كە دەیگاتێ بە دڵنیاییەوە بەدەستی دێنێ،بەڵام جۆری هەوڵدان و خێرایی لە كۆششەكانیدا دوور و نزیكی كاتی سەركەوتنەكانی دیاری دەكات،خوێنەری ئازیز ئەم نامیلكەیەی لەبەر دەستتدایە لە دەقی نامیلكە لانەدەی لە ڕاهێنانەكاندا وە دەبێ بەلایەنی كەمەوە دوو جار بخوێنرێتەوە پاشان دەست بەجێبەجێكردنی خەواندنی موگناتیسی و ڕاهێنانەكانی بكەی وە دڵنیات دەكەمەوە بە تەنیا خوێندنەوەی ئەم نامیلكەیەی بەردەستت فێری خەواندنی موگناتیسیت دەكات لەماوەی ( ١٥ ) خولەك دا تەنانەت ئەگەر باوەڕیشت بەخۆت نەبێت یا خودا نەخواستە هەردوو چاویشت نابینا بێت ئەتوانم بڵێم ئەمە تەنیا دەروازەیەكی واڵاكراوی كوردییە بۆ خەواندنی موگناتیسی. لەبورانی كەموكوڕی نامیلكە سوپاستان دەكەم ئەوە تەنیا خودایە دوورە لە هەموو كەموكوڕییەك.

نوسەر/عادل فەرهاد

٢٠١١/٩/٢٩

هەڵەبجە

(هیپنۆتیزم)حاڵەتێکی بێ هۆشیە واتە وەك نوستن وایە تێیدا مرۆڤ لەلایەن کەسێکی دیکەوە کۆنترۆڵ دەکرێت.

دوو جۆر خەواندنی موگناتیسیمان هەیە :

١-خەواندنی نائارەزوومەندانە.

٢-خەواندنی ئارەزوومەندانە.

یەکەمیان: واتە خەواندنی نائارەزوومەندانە. واتە ئەو کەسەی کە دەخەوێنرێت بە نائارەزوومەندانە لەلایەن کەسێکەوە دەخەوێنرێت کە بە ڕاهێنان گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی تواناى خەواندنی زۆر بەهێزە ئەمەش هەروا بە ئاسانی مرۆڤ نایگاتێ. لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بە چەند ڕاهێنانێك بکەم کە مرۆڤ دەگاتە ئەو ئاستەی کە بە ئاسانی کەسەکان بخەوێنێت بە نائارەزوومەندانە.

## ( ڕاهێنانی یەکەم )

بۆ ئەوەی توانای خەواندنمان بەهێزبێت دەبێت هەنگاو بە هەنگاو ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکەین.

أ-خاڵێکی ڕەشی تۆخ کە نە زۆر گەورە نە زۆر بچووك بە قەد بیلبیلەی چاو بێت ئەم خاڵە لەسەر پەڕەیەکی سپی بێ خەت و لە ناوەڕاستی پەڕەکەدا درووستی بکە.

ب-ئەو پەڕە سپییە بێ خەتەی کە خاڵەکەی لەسەرە بینوسێنە بە دیوارێکەوە ئەو پەڕە سپییە دەبێت (٢٠) سم پانی بێت.

ت-دەبێت بەرامبەر خاڵە ڕەشەکە دانیشیت باشتر وایە لە زەویدا دانیشی نەوەك لەسەر کورسی.

دوای ئەوەی کە ئەو خاڵەت جێبەجێکرد، دەبێت هەندێك هەنگاوی دیکە بگریتە بەر لەوانە.

أ- پیاڵەیەك ئامادەبکە و یەك کەوچکی بچووك خوێی تێبکە واتە بەم شێوەیە :

- پیاڵەی چا خواردن.

-بە کەوچکی چا یەك کەوچك خوێ.

-ئاوی سارد.

## ( تێکەڵاوکردنی )

دواى تێکەڵاوکردنی( ئاو+خوێ )کە چاوت بە کراوەیی دەخەیتە ناو پەرداخەکەوە بۆ ماوەی ( ٥ ) چرکە دواى چاوی ڕاست چاوی چەپ پاشان بۆ ماوەی ( ٥ ) خولەك، دواى ئەم ئاو و خوێیە دەبێت بۆ ماوەی ( ٥ ) خولەك هەردوو چاوەکانت داخەیت. دواى ئەم دەست بکە بە ڕاهێنان بەرامبەر بە خاڵە ڕەشەکە، با ( ٧٥ )سم لێتەوە دووربێت وا باشترە جلوبەرگی خەوت لەبەردا بێت وە ئەم شوێنەی کە ڕاهێنانی تێدا ئەنجام دەدەیت با دەنگە دەنگی تێدا نەبێت لە ڕووی گەرما و سەرماوە با مامناوەند بێت، وا باشترە بە تەنها خۆت بیت هەردوو چاوو ڕووبکەرە خاڵە ڕەشەکە بێ چاو تروکاندن بزانە چەندت لە توانادایە چاو دانەخەیت بۆ نمونە ئەگەر یەکەم جار تا ( ١٥ ) چرکە چاوت دانەخست بەردەوام بە لەسەر ڕاهێنان تا سێ جار دواى ئەمە وازی لێ بهێنە تا ( ٤-٦ ) کاتژمێر دواى ئەم شێوەیە دەست بکەرەوە بە ڕاهێنان بەو شێوەی سەرەوە تا وات لێ دێت بۆ ماوەیەکی زۆر ڕاهێنان ئەنجام بدەیت بێ چاو تروکاندن. بۆئەوەی بتوانیت بە نائارەزوومەندانە کەسەکان بخەوێنیت، ئەم ڕاهێنانە دەبێت بە شێوازی هێمنانە بێت،

چونکە هەموو کەسەکان ناتوانن ئەم ڕاهێنانە ئەنجام بدەن، لێرەوە بەرەو پێش چوونی تۆ دەست پێدەکات لەم کارە دا دەبێت خۆڕاگر بیت بۆ ئەوەی بگەیتە ئەنجام.

**( ڕاهێنانی دووەم )**

بە هەمان شێوەی ڕاهێنانی پێشوو، بەڵام بۆ سەیرکردن ئەمجارە مۆمێك بەکاردێنی بە داگیرساوی سەیری ئەو مۆمە دەکەیت دەبێت هەموو ئامێرە ڕۆشن کەرەوەکان بکوژێنیتەوە جگە لەو مۆمە. نابێت ڕۆشنایی هەبێت لەو شوێنە دا، ئەم ڕاهێنانە لەسەر شێوازی پێشوو ئەنجام دەدەیت و دەبێت ئەو مۆمە یەك مەتر لێتەوە دوور بێت، دوای ئەم ڕاهێنانە پشوویەك بدە دوای پشووەکە بەردەوامبە لەسەر ڕاهێنان.

## ( ڕاهێنانی سێیەم )

سەیرکردنی مانگ بە شەودا ئەم ڕاهێنانە زۆر ئاسانە هەموو کەسەکان دەتوانن ئەنجامی بدەن ئەم ڕاهێنانەش لەسەر شێوەی پێشووە.

## ( ڕاهێنانی چوارەم )

سەیرکردنی خۆرە کە ئەم ڕاهێنانە باوکی ڕاهێنانەکانە بە نیو کاتژمێر پێش ئەوەی خۆر ئاوابێت لەم کاتەدا خۆر تینی نامێنێت، ئەمەش پێویستی بە وردەکاری هەیە لە ڕووی سەیرکردنەوە واتە لە چرکەوە دەست پێ بکە تا چەند دەتوانیت سەیربکەیت وە دەبێت بەردەوام بیت لەسەری بۆ ئەوەی بتوانیت سەرکەوتووبیت، بزانە ڕۆژی یەکەم چەند دەتوانیت تا ڕۆژی دووەم و سێیەم و چوارەم بۆ نمونە ئەگەر لە هاویندا کاتژمێر (٧) خۆر ئاوا بوو ئەوا تۆ لە (٦:٣٠) خولەکەوە دەست پێ دەکەیت بۆ ڕۆژی دواتر لە (٦:٢٥) خولەکەوە دەست پێ دەکەیت وە بۆ ڕۆژی دواتر لە (٦:٢٠) خولەکەوە بۆ ڕۆژی دواتر لە (٦:١٥) خولەکەوە دەست پێ دەکەیت، ئەمانەی سەرەوە چەند ڕاهێنانێك بوون بۆ ئەوەی بتوانیت زۆر بە ئاسانی کەسەکان بخەوێنیت زیاتر

سەرکەوتوو دەبیت، سەرەڕای ئەم ڕاهێنانە چەند ڕاهێنانێکی تر هەیە دەبێت جێبەجێ بکرێت کە زۆر گرنگن ، لەوانە (کەم خواردن، ئارامگرتن، کەم خەوتن، کەم گۆیی)

ئەوەی لەسەرەوە کە ئاماژەمان پێدا لە هەرە گرنگی ڕاهێنانەکان بۆیە باشتر وایە دوو جار زیاتر ئەم نامیلکەیە بخوێنرێتەوە پاشان دەست بە ڕاهێنان بکەیت.

## خەواندنی ئارەزوومەندانە

خەواندنی ئارەزوو مەندانە، سەرەتا دەبێت پرسی رازی بوون لەو مرۆڤە وەربگیرێت کە دەتەوێت بە خەوی موگناتیسی بیخەوێنیت.

لێرەدا دەبێت چەند خاڵێك هەیە جێبەجێ بکرێت وەکو:

١-دەبێت ئەو کەسەی دەخەوێت ڕازی بێت و لەسەر ویستی خۆی بێت.

٢-متمانەی تەواوی هەبێت بە کەسی خەولێخەر.

٣-نابێت ترسی هەبێت کاتێك دەخەوێت.

٤-دەبێت تەمەنی ئەو کەسەی کە دەخەوێت لە ( ٥ ) ساڵ کەمتر نەبێت.

٥-وە زۆر پیریش نەبێت.

٦-دەبێت نەخۆشی پەرکەم یا بوورانەوەی لەگەڵدا نەبێت.

٧-باشترە دوو کاتژمێر پێش نان یاخود دوو کاتژمێر پاش نان خواردن بێت.

لە خەواندنی ئارەزوومەندانەدا ( تەڵقین ) بە بنەمای سەرەکی دادەنرێت، کاریگەرترین تەڵقین ( قورئانی پیرۆزە ) هەندێك ( تەڵقین )ی لاوەکیشمان هەیە وەکو ( موزیك،شیعر،گۆرانی،وە شەپۆلەکانی کارۆ موگناتیسی،وە کتێب خوێندنەوە جۆرێکی تری ( تەڵقین )ە.

کاتێك دەتەوێت بە ئارەزوومەندانە یان نائارەزوومەندانە کەسێك بخەوێنیت باشتر وایە ئەم ڕێگایانە بگریتە بەر:

١-شوێن لە ڕووی جێگەوە دەبێت بەدڵی ( خەولێخراو )بێت.

٢-ئەو شوێنە دەبێت کەمێك مەیلەو تاریك بێت.

٣-ڕەخساندنی جێگەیەکی هێمن.

٤-کەشێکی پاك بێت واتە هەوای پاك بێت.

٥- پۆشینی جلوبەرگی خەو.

٦- پاك بوونی جەستەی خەولێخەر و خەولێخراو.
٧-لە ڕووی گەرما و سەرماوە مامناوەندبێت.
دەبێت ئەم خاڵانەی سەرەوە جێبەجێ بکەیت تا سەرکەوتووبیت لە خەواندنەکەدا.

## سەرەتای بە کرداریکردن:

١-بەناوی خواوە دەست پێ دەکەیت.
٢-ئەو کەسەی کە دەیخەوێنی پرسیاری لێ دەکەیت بزانی حەزدەکات لەسەر ( کورسی ) یان بە ( ڕاکشاوی )لەسەر زەوی یان هەر چۆنێك خۆی ئارەزووی بێت.
٣-دەبێت کەسی بەرامبەر بڕوای بەم کارە هەبێت.
٤-سەرەتا پێی دەڵێیت کە بە لوت هەناسەی زۆر قوڵ هەڵمژە و چەندت لە تواناداا هەیە لە سییەکاندا بیهێڵەوە پاشان لەسەرخۆ بەدەم هەناسە بدەرەوە وە ( ١٥ ) جار ئەم هەناسەیە بەم شێوەیە هەڵمژە و بە دەم هەناسەکە بدەرەوە پاشان پێی دەڵێیت بە هەردوو چاوت سەیری لوتت بکە بەبێ ئەوەی چاوت بتروکێنی تا چاوەکانت ماندوو دەبن کە چاوەکان ماندوو بوون با چاوەکانی دابخات لەم کاتەدا پێی دەڵێیت ئیتر بەهیچ

شێوەیەك مەجوڵێ بە شێوەیەکی دڵسۆزانە بە دەنگێکی کەمێك نزمەوە دەست بکە بە ( تەڵقین ).

## شێوەی ( تەڵقین )

تەڵقین: لە وشەی ( طللقة )ی عەرەبیەوە وەرگیراوە بە واتای دەرچوون کاتێك کە (ین)ی دەچێتە سەر دەبێتە دەرچوونی زانیاریەك کە بەبێ بیرکردنەوە وەردەگیرێت، ئەگەر تەمەنی لە (١٠-٢٠)ساڵ بوو لە ژمارە (١-٧٠)حەفتا دەژمێری، ئەگەر لە (٢٠) ساڵ زیاتر بوو ئەوا لە (١-١٠٠) دەژمێری ئەگەر پێویستی کرد (١٥) ژمارەی تریشی بۆ زیاد دەکەی کە لە دواییدا بەڕوونی باسی دەکەین، بە شێوەیەکی هێمن و بە دەنگێکی نزمەوە پێی دەڵێیت ئێستا من هەر وشەیەك کە دەیڵێم لە جەستەی تۆدا دەبێتە کرداری هەر ( تەڵقینێکیشت ) دەدەمێ بەبێ بیرکردنەوە وەریدەگریت ئێستاش لە ژمارە (١)ەوە دەست پێ دەکەم تا ژمارە (١٠٠) ئەگەر تەمەنی لە (٢٠) ساڵ زیاتر بوو وردە وردە لە نوکی پەنجەی پێیەکانتەوە جەستەت خاودەبێتەوە وە دەڵێیت بە زوویی تواناى جوڵانت نامێنێت هەست بە حەوانەوەیەکی زۆر بەچێژ دەکەیت، کاتێك دەڵێیت (١)سێ جار بەقەد ژمارە یەك بووەستە، کاتێك دەڵێیت

**( ٢ ) بەقەد سێ جاری دوو بوەستە بەم شێوەیە لەسەر خۆت ژمارەکان دەژمێری جەستەی دابەش دەکەیت بەسەر ژمارە ( ١٠٠ ) دا وەك لەم وێنەیە دا دیارە**



**بە پێی ئەم ژمارانە بە شێوازێکی زۆر جوان تەڵقینی دەکەین کە ئێستا زیاتر هەست بە حەوانەوە دەکەین وەکو کەسێکی لەش ساغی چالاکی بە کەیفی کەسێکی سەرکەوتووی خۆشەویستی لەناو خەڵکدا وە کەسێکیت توانای چارەسەری گرفتەکانت هەیە کەسێکی زیرەکیت کەسێکی لێهاتوویت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا بەم شێوەیە تەڵقینی دەکەین بە شێوەیەکی زۆر بەرزی دەروونی پاشان دەست دەکەینەوە بە ژمارە ژماردن بەشێوازێکی زۆر زۆر وریا بەدەنگێکی نزمتر لە پێشوو و کاتێك گەشتینە ژمارە نەوەد بڵێ لە ژمارە ( ٩٠ )ەوە**

دەژمێرم تا ژمارە (١٠٠) ئیتر دەچێتە خەوێکی زۆر خۆش کاتێك لە ژمارە (٩٠) دەست بە ژماردنی ژمارە دەکەم تا دەگەمە ژمارە (١٠٠) ڕووناکییەك دەبینی لە دوورەوە بەرەبەرە ڕووناکیەکە زیاد دەکات لەم کاتەدا بەشێوازێکی نەرم پرسیاری لیٚ بکە بڵیٚ ئەو ڕووناکییە دەبینی؟ پێت دەڵیٚ بەڵیٚ ئەگەر وتی بەڵیٚ ئەوە چووەتە خەوی موگناتیسیەوە پێی بڵیٚ برۆ بۆ لای گڵۆپەکە کاتێك بەرەو گڵۆپەکە دەکەوێتە ڕێ پێی بڵیٚ لەو دەرگایەوە برۆ ژوورەوە کە ڕووی لای تۆیە پێی بڵیٚ چوویتە ژوورەوە؟ ئەگەر وتی بەڵیٚ پێی بڵیٚ لە دەرگاکەی ترەوە برۆ دەرەوە ئەگەر چوو ئەوا دەتوانی لەلای ئەو دەرگایەی کە ناردووتەتە دەرەوە سەیارە یان فرۆکە یان کەشتی، هەر شتێك خۆت پێی بڵیٚ ی ئەو بەگوێت دەکات و دەینێری بۆ ئەو شوێنەی کە خۆت دەتەوێت بچێت، ئەوەی لێرەدا گرنگە دەبێت وابزانی بەڕاستی لەگەڵیدا گەشت دەکەیت واتە نەهێڵی زیانی پیٚ بگات، بۆ نموونە بە پیٚ مەینێرە بۆ شوێنە دوورەکان کە برسی بوو با بڕوات لە چێشتخانەدا نان بخوات بەهەمان شێوە بۆ شتی تر، پێش ئەوەی باسی چۆنیەتی هێنانەوەی بکەین هەندیٚ جار کاتێك دەگەیتە ژماردنی ژمارە (١٠٠) بەو کەسە دەڵێیت خەوتوویت؟ دەڵیٚ نەخێر، لێرەدا نابێت وابزانی کە

نەخەوتووە پێی بڵێ هەستە بڕۆ پاش کەمێك ئەگەر وتی ڕۆشتم ئەوا خەوتووە، بەڵام لەم کاتەدا ئەو هەستی خەوتووە نەستی بەخەبەرە بۆیە وانازانێ کە خەوتبێ وە جاری واش هەیە ژمارە (١٠٠) تەواو دەکەین پێی دەڵێیت ئەو روناکیە دەبینی وەڵام ناداتەوە دوو سێ جار پرسیاری لێ بکە بەنەرمی، ئەگەر وەڵامی نەدایەوە ئەوە ئەو تەڵقینە کە کردووتە دەمارەکانی دەم و لێوی خاو بوونەتەوە توانای وەڵام دانەوەی نەماوە لەم حاڵەتەدا بەهێواشی پەنجەیەکت بهێنە بە لووتیدا بۆ ئەوەی بەئاگا بێتەوە کە لەژێر کۆنترۆڵی تۆدایە. باشتر وایە کاتێك گەیشتیتە ژمارە (١٠٠) لە (٣) چرکەوە تا (١٥) چرکە بوەستێ وە لەمە زیاتر نەوەستیت لەسەری، چونکە دەچێتە خەوی ئاساییەوە وە پاشان پرسیاری لێ دەکەیت ئەو رووناکیە دەبینی؟

کاتێ ووتی رووناکی نابینم وە بەشێوەیەك لەشێوەکان خەوی موگناتیسی پێوە دەرنەکەوتبوو کە لە دواییدا باسی دەکەین ئەوا لەم کاتەدا دەتوانیت (١٥) ژمارەی تر بژمێری، بڵێی ئێستا لە ژمارە (١ تا ١٥) دەژمێرم هەموو لەش زیاتر خاو دەبێتەوە وە سەرت قورس دەبێت بە جۆرێك کە دەنوسێ بە سەرینەکەوە بە دڵنیاییەوە دەچێتە خەوێکی خۆشەوە دەتوانی

ئەم کردارە چەند بارە بکەیتەوە بۆ ئەو کەسانەی کە تەمەنیان لە سەروو (٤٠) ساڵیەوەیە بەم شێوەیە بەردەوام دەبیت تا دەچیتە خەوی موگناتیسیەوە.

پاش ئەوەی ئەو گەشتەی کە بردبووت بۆ ئەو شوێنانە کە خۆت مەبەستت بوو پێی دەڵێت وەرەوە ئەو شوێنەی کە راکشابووی، پێی دەڵێت هاتیتەوە ئەم شوێنە راکشایتەوە ئەویش دەڵێت بەڵێ. بەشێوازێکی زۆر جوانی مرۆڤانە (تەڵقین)ێکی دەروونی باشی بکە پاشان پێی بڵێ ئێستا لە ژمارە (١٥)ەوە دەژمێرم تا ژمارە (١) ئیتر جەستەت وەك خۆی لێ دێتەوە وەکو کەسێکی زۆر دڵخۆشی زیرەك بەشێوازێکی زۆر هێمن ژمارەکان بە لەسەرخۆیی دەژمێری کاتێك گەیشتیتە ژمارە (١) پێی دەڵێت ئێستا دەتوانیت چاوەکانت بکەیتەوە وە جەستەت بجوڵێنیت لەسەری دەوەستیت تا خۆی لەشی دەجوڵێنێت وە چاوەکانی دەکاتەوە باشتر وایە تا (٢) خولەك وازی لێ بهێنرێ و پرسیاری لێ نەکرێ، باشتر وایە پەرداخێك ئاو یان هەر شلەیەکی دیکەی بدرێتێ بەڵام کاتی وا هەیە لە ئەنجامی ماندوو بوونێکی زۆر لە گەشتەکەیدا لە ژمارە (١٥)ەوە بۆ (١) دەژمێری بەڵام ئەو ناگەڕێتەوە بۆیە باشتر

وایە لێی گەڕێی تا بۆخۆی بخەوێتەوە پاش کەمێکی تر بهێنرێتەوە.

## نیشانەکانی خەوتنی موگناتیسی

١. گۆڕانی رەنگی دەموچاو هەندێ جار سوور دەبێت.
٢. هەناسەی دەگۆڕێ و بەرزو نزم دەکات.
٣. جوڵاندنی بیلبیلەی چاوی لەژێر پێڵوەکانیەوە.
٤. لەهەندێ جاردا وشك بوونەوەی لێو یان زەرد هەڵگەڕانی.
٥. خاوبوونەوەی لەشی، وەك بێ گیانی لێ دێ.

## سودەکانی خەواندنی موگناتیسی

١. لەبواری ئابووریدا.
٢. لەبواری رامیاریدا.
٣. لەبواری زانستیدا.
٤. پێشبینی کردن.

## سەرچاوەکان:

١-اسرار خود هیپنوتیزم
صمد ولیزاده
٢-خۆ پرۆگرام کردن لەڕێگەی خەونی دەستکردەوە
نوسەر: بەختیار أحمد صالح
٣-سیخوڕی کردن بە ئامێری سیخوڕی
بەرگی دووەم، ئاماژ جاف
٤-خەواندنی موگناتیسی بە تەڵقین
د. ابراهیم فەقیٚ
٥- پاراسایکۆلۆجی ڕیٚگای فیٚربوون و بەکارهیٚنانی
ئاماژ جاف

*ئەگەر دەتەویٚت ببیتە خەوڵخەریٚکی سەرکەوتووی موگناتیسی.

*تەنانەت ئەگەر باوەڕیشت بەخۆت نەبیٚت لەڕیٚی ئەم نامیلکەوە دەتوانیت ببیتە مرۆڤیٚکی خەولیٚخەری موگناتیسی.

*خودا نەکردە ئەگەر هەردوو چاویشت نابینا بیٚت دەتوانیت ببیتە مامۆستای خەواندنی موگناتیسی.

لەم نامیلکەدا:
هیپنۆتیزم چییە؟
جۆرەکانی چین؟
ڕاهێنانەکان

نرخ: 1500 دینار